# تفسير القرآن العظيم

مُسنداً عن

الرسول صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين

للإمام الحافظ الناقد المفسر

أبي محمد عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي

رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى

المُتَوَفَّى سَنَة ٣٢٧هـ

سورەتی: المائدة

"وەرگێڕانی : عليكم بالسنة"

بەرگی پێنجەمی تەفسیری إبن أبي حاتم سورەتی المائدة یە، ئەمجارە تەفسیرەکە جیاوازترە لەوانی تر، محقق لەسەرەتاوە ئەو ئەثەرانەی باسکردووە کە ون بوونەو نەماون، کە تەفسیری سەرەتای سورەتی المائدة تاوەکو کۆتایی ئایەتی **٣٩**، کە لەو تەفسیرەدا هەبووە بەڵام ون بوونە جا محقق کۆیکردووتەوە لەپاڵ هەر ژمارەیەک پیتی (ف) کردووە وەک ئاماژەدانێک پێی تاکو بزانرێ .

١ - **خیثمة** وتی : هەموو شتێ لە قورئاندا [کە ئاوا هاتبێ] : (یَٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُوٓاْ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١]، ئەوە لە تەوراتدا [بەوشێوازە هاتووە] : ئەی هەژاران .

(یَٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٢]

٢ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ)، وتی : موشریکان کە حەجی ماڵی خوایان کرد، وە قوربانیان پێشکەش دەکرد، وە درووشمەکانی حەجیان بە گەورە سەیردەکرد، وە ئاژەڵیان سەردەبڕی لە حەجەکانیان، بۆیە مسوڵمانەکان ویستیان ئەوە دەربارەی ئەوانەوە بگۆڕن،

الله تعالى فەرمووی : (لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ)، وە لەو ئایەتەدا : (وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ)، واتە : درووست نییە کەوا لەو مانگەی دیاریکراوە شەڕی تێدا بکەن [ کە بریتین لەو چوار مانگە : ذو القعدة، وذو الحجة، والمحرم، ورجب] .

(وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ)، واتە : ئەوانەی کەوا ڕوو لە کەعبەی پیرۆز دەکەن، ئیمانداران و موشریکان هەموویان حەجی بەیتیان دەکرد، الله تعالى نەهی لەوە کرد کە ئیمانداران ڕێگری بکەن لەهەرکەسێ کە دەیەوێت حەج بکات، یان ناڕەزایی دەربڕن بەرامبەر ئیمانداران و کافران،

پاشان الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند : (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ) [سُورَةُ التَّوبَة : ٢٨] .

وە لەو ئایەتەدا : (يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا)، واتە : ئەوان الله یان لە خۆیان ڕازی دەکرد بە حەجکردنیان، (وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ)، دەڵێت : دوژمنایەتی قەوم [واتە دوژمنایەتی و ڕقتان بۆ ئەوان واتان لێنەکات ستەمیان لێبکەن بەهۆی ئەوەی کە لەساڵی حودەبیە ڕێگربوون] .

(وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ)، دەڵێت : (ٱلۡبِرِّ) : ئەوەی الله فەرمانی پێکردووە، وە (ٱلتَّقۡوَىٰ) : ئەوەی الله ڕێگری لێکردووە .

٣ - **عطاء** دەڵێت : پێنج ئایەت لە کتابی الله تعالى بۆ ڕوخسەتە، نەک ئەوەی کە جێگیربێ لەسەریان، (فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ) [سُورَةُ الحَجّ : ٢٨]، ئەوەی ویستی بیخوات، وە ئەوەی ویستی با نەخوات .

(وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ)، [سُورَةُ المَائـِدَة : ٢]، ئەگەر ویستی با بیکات [ڕاوبکات]، ئەگەر ویستی با وانەکات .

(وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ) [سُورَةُ البَقَرَة : ١٨٥]، ئەوەی ویستی با بەڕۆژوو ببێت، وە؟ئەوەی ویستی با بشکێنێت و بەڕۆژوو نەبێت .

(فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ) [سُورَةُ النُّور : ٣٣]، ئەگەر ویستی با موکاتەبەیان بکات [واتە بەڵێننامەی ئازادکردنیان لەگەڵ واژوو بکرێ و دوای ئەوە ئازاد بکرێن]، وە ئەگەر ویستی با وانەکات .

(فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ) [سُورَةُ الجُمُعَة : ١٠]، ئەگەر ویستی با بڵاوەی بکات، وە گەر ویستی با بڵاوە نەکات [واتە دوای تەواو بوونی نوێژی جومعە] .

٤ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ)، دەڵێت : ئەوەی کە بۆ غەیری الله سەردەبڕێ و بۆ طاغوتەکان سەردەبڕێ

(وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ)، ئەو ئاژەڵانەی کە دەخنکێنرێت و پاشان دەمرێت .

**(وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ)**، ئەو ئاژەڵانەی کە لێیان دەدرێت بە دار و پاشان دەمرن [بەڵام مەرج نیە بەس بەدار بەهەر شتێک بریندار بکرێ و لێی بدرێت پاشان مردار ببێتەوە بێ ئەوەی سەری ببڕدرێ ئەوا حەرامە، واللە اعلم] .

**(وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ)**، ئەو ئاژەڵانەی کە لەسەر شاخ دەخرێنە خوارەوە و پاشان دەمرن .

**(وَٱلنَّطِيحَةُ)**، ئەو ئاژەڵانەی کە شەڕە قۆچ دەکەن .

**(وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ)**، وە ئەوەی کە ئاژەڵە دڕندەکان بیخوات [وەک شێر و پڵنگ و گورگ، چونکە بەبێ سەربڕین مردار دەبنەوە] .

**(إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ)**، [جگە لەمانەی باسکران]، ئەوەی سەری ببڕن و ڕوحی لەبەرمابێت ئەوا بیخۆن .

**(وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ)**، دەڵێت : **(ٱلنُّصُبِ)** : ئەوەی کە سەریان دەبڕی بۆ بتەکان، وە بۆ بەگەورە زانینیان .

**(وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ)**، دەڵێت : کە ئەویش بەختگرەوەیە کە بۆ کارەکانیان دابەشیان دەکرد و ئەنجامیان دەدا [واتە بۆ ئەوەی کاری ئەنجام بدەن و دڵنیابن لەوەی کە باشە بیکەن یان خراپ، ئەوا سێ داریان دەهێنا لەسەر دانەیەک

دەیاننوسی بکە، لەویتریش مەیکە، لەوەیتر هیچیان نەدەنوسی، جا گەر (بیکە) بۆی بهاتایە پێشەوە ئەوا کارەکەیان ئەنجام دەدا، گەرنا نەیاندەکرد، ئەمە لەسەردەمی جاهیلی ئاوا دەکرا بەڵام لەئیسلام بۆ هەرکارێ نوێژی استخارەی دانراوە کە بیکەین، والله اعلم] .

(ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ)، واتە: ئەوەی ئەوانە بخوات [کە باسکران] ئەوا فیسقە .

٥ - **ابن عباس** دەڵێت: (الرادة): ئەوەیە کە لەبیر دەخرێتە خوارەوە، (وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ)، ئەوەیە کە لە شاخەوە دەخرێتە خوارەوە .

٦ - پرسیار کرا لە **الزهري**: دەربارەی خواردنەوەی میز بۆ چارەسەرکردن .

وتی: ئەوە لە پاکەکان نییە .

٧ - **مكحول** دەڵێت: الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند: (وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ) [سُورَةُ الأَنعَام: ١٢١] .

پاشان الله تعالى نەسخی كردەوە و ڕەحمی بە مسوڵمانان كرد، فەرمووی : (ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٥]، بەوە نەسخی كردەوە، وە خواردنی ئەهلی كیتابی حەڵاڵ كرد .

٨ - **ابن زيد** وتی : (التعزير)، وە التوقير : [بە مانای] سەركەوتن و گوێڕایەڵی كردن دێت [التوقير : خۆی وشەكە بەمانای بەگەورەدانان ڕێز دێت] .

٩ - **ابن عباس** دەڵێت : هەركەسێ كافربێ بە ڕەجم [واتە باوەڕی بە ڕەجم نەبێت]، ئەوا كافر بووە بە قورئان بەشێوەیەك هەر هەستی پێنەكردبێ، الله تعالى دەفەرموێت : (يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٥] .

دەڵێت : ڕەجم لەوانەیە كە شاردبوویانەوە .

---

: ڕەجم باسكراوە لە تەوڕات و ئینجیل بەڵام ئەهلی كیتاب شاردبوویانەوە، جا الله تعالى كە رسول الله ﷺ نارد، ئەو هەمووی ئاشكرا كرد و دەریخست .

**١٠** - لە تميم واتە : ابن مالك المقرئ وتی : گوێم لە **أبا الدرداء** بوو دەیوت : ئەگەر دڵنیاببمەوە لەوەی کە اللە تعالی یەک نوێژی لێ قبوڵ کردووم ئەوا لەلام خۆشەویسترە لەدونیا و لەوەشی کە تێیدایە، اللە تعالی دەفەرموێت : (إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٢٧] .

**١١** - ميمون . أبي حمزة . وتی : لەلای **أبي وائل** دانیشتبووم، پیاوێ هاتە لامان، کە پێی دەوترا أبو عفيف هاوەڵی معاذ، شقيق بن سلمة پێی وت : ئەی باوکی عفيف، ئایە قسەمان بۆ ناکەیت دەربارەی معاذ بن جبل؟

وتی : بەڵێ .

[أبا عفيف] وتی گوێم لە [معاذ بن جبل] بوو دەیوت : خەڵک لە یەک شوێن جێگیر دەکرێن، بانگدەرێک بانگ دەکات : لەکوێن تەقواداران؟

لە تەنیشت الرحمن ـەوە هەڵدەستن، اللە تعالی لەگەڵ ئەواندا هیچ پەردەیەک نیە، وە هیچ داپۆشراویەک نییە [واتە هیچ شتێ نیە لەنێوان ئەوان و اللە تعالی کە نەتوانن اللە ببینن] .

وتم : کێن تەقواداران؟

وتی : کۆمەڵانێک کە لە شیرك و پەرستنی بەردەکان ترساون، وە بەدڵسۆزیەوە پەرستشیان کردووە، ئینجا بەرەو بەهەشت دەڕۆن .

## شێوازی کوشتنی هابیل

١٢ - لەوکاتەی ویستوویەتی بیکوژێت بە زەخت لەسەر ملی [ویستویەتی بیکوژێت]، پاشان ئیبلیس ئاژەڵێک دێنێ سەری دەخاتە سەر بەردێک، پاشان بەردێکی تر دێنێ، بەو بەردە لەسەری دەدات تاوەکو دەیکوژێت، کوڕی ئادەمیش علیه السلام سەیری دەکات، بەهەمان شێوە لەگەڵ براکەیدا دەکات .

١٣ - **یزید الفقیر** [الفقیر لەقەبی خۆیەتی] دەڵێت : لای جابر بن عبدالله دانیشتبووم قسەی دەکرد، قسەی دەربارەی ئەوەی دەکرد کە خەڵکانێ لە ئاگر دێنە دەرەوە، وتی : من ئەوکاتە ئینکاری ئەوەم دەکرد، کە تەواو بوو وتم : چەند سەیرن ئەم خەڵکە، بەڵام سەیرتر ئێوەن ئەی هاوەڵانی محمد ﷺ، پێتان وایە کە الله تعالى خەڵکانێ دێنێتە دەرەوە لەئاگر، وە الله تعالى

دەفەرموێت : (يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَاۖ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٣٧] .

هاوەڵەکانی سەرزەنشتیان کردم، نەرمترینیان لەنێویاندا وتی : وازی لێبێنن .

ئەوە بۆ کافرانە، ئەوەی خوێندەوە : (إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ)، تا گەیشتە : (وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)، [سُورَةُ المَائـِدَةِ : ٣٦]، ئایە قورئانت خوێندووتەوە؟

وتم : بەڵێ کۆمکردووتەوە،

وتی : ئایە الله نافەرموێت : (وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا)، [سُورَةُ الإِسرَاء : ٧٩] ؟

ئا ئەوە مقامە، کە الله تعالى کۆمەڵانێک لە ئاگر دەهێڵێتەوە بەهۆی تاوانەکانیان ئەوەی بیەوێت قسەی لەگەڵدا ناکات، ئەگەر بیەوێت دەریانهێنێت ئەوا دەریاندێنێت .

[یزید الفقیر] وتی : لە دوای ئەمە جارێکی تر نەگەڕامەوە سەر ئەوەی کە بەدرۆی بخەمەوە .

: ئەو ئەثەرانەی کە محقق کۆیکردبوویەوە لەکاتێ کە ون ببوون ئەوا تەواو بوون.

(أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ٤٠] .

١٤ - **حكيم بن حزام** دەڵێ : رسول الله ﷺ لەنێو هاوەڵەکانیدا بوو، پێیانی فەرموو : ئایە ئەوەی من دەبیستم ئێوەش دەیبیستن؟

وتیان : ئێمە هیچ شتێک نابیستین .

رسول الله ﷺ فەرمووی : من دەنگی أطیط ی ئاسمان دەبیستم .

لۆمە ناکرێن لەسەر ئەوەی کە ئەو دەنگە نابیستن [واتە ئەو دەنگەی کە پێی دەوترێ : أطیط] .

هیچ شوێنێک نییە ئیللا فریشتەیەکی لێیە کە سوجدەی بردووە یان وەستاوە .

(يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٠]

١٥ - **السدي** لەم ئایەتەدا : (يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ) دەڵێت : [الله تعالی] هەرکەسێکی بوێت لەناوتاندا دەیمرێنێت لەسەر کوفر، پاشان سزای دەدات .

بەهەمان شێوە **السدي** لەم ئایەتەدا : (وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ) دەڵێت : هەرکەسێکی بوێت لەناوتاندا لەدونیادا هیدایەتی دەدات، پاشان لێی خۆشدەبێت .

١٦ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤١]

دەڵێت : ئەوانە یەهوودن .

١٧ - هەروەها **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤١] .

دەڵێت ئەوانە دووڕووەکانن .

١٨ - بەهەمان شێوە لە مجاهد ڕیوایەت کراوە .

(سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤١]

١٩ - **جابر بن عبد الله** دەڵێت : یەهوودیەکانی مەدینە بوون .

٢٠ - **مقاتل بن حيان** دەڵێت : ئەوانە یەهوودیەکان بوون لە بەنی قریظة و نضیر، کە تێیاندابوو : لبابة بن سمعنة، وە کعب بن الأشرف، سعید بن عمرو .

٢١ - وە **السدي** دەڵێت : ئەوانە أبو بسرة و هاوەڵەکانی بوون .

٢٢ - **جابر** لەم ئایەتەدا : (يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤١]

دەڵێت : [ئەوانە] ئەهلی فدك ن [فدك : گوندێکی جولەکە بووە نزیک بووە لە شاری رسول الله ﷺ] .

٢٣ - **مقاتل بن حيان** لەم ئایەتەدا : (يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ)، دەڵێت : زیاد و کەمی دەکەن .

٢٤ - **ابن عباس** لە هەمان ئایەتەدا دەڵێت : واتە : سنوورەکانی الله لە تەوراتدا دەسکاری دەکەن [وە دەیگۆڕن] .

٢٥ - **السدي** لەم ئایەتەدا : (يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ٤١]

دەڵێت : ڕەجمیان گۆڕی و کردیانە جەلدکردن .

(أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْۚ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ٤١] .

٢٦ - **ابن عباس** وتی : ئەوە ناوی لێنراوە (القلبُ)، لەبەر هەڵگێڕانەوەی [واتە لەبەر خێرا گۆڕینی دڵ، والله اعلم] .

٢٧ - **السدي** لەم ئایەتەدا : (لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌۖ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ٤١] .

دەڵێت : هەروەها ڕیسوایی ئەوان لەدونیادا ئەوەیە کە کاتێک مهدي القسطنطينية ڕزگار دەکات ئەوانیش دەکوژێت ئەوە ڕیسواییە لە دونیادا

## تەفسیری (السحت) چییە؟

**٢٨ - عبد الله** وتی : ڕەشوە وەرگرتنە لە دین .

**٢٩ - مسروق** وتی : قازی ئەگەر [ئەوەی بەدیاری بۆی دێنن] بیخوات، ئەوا ڕەشوەی خواردووە، وە ئەگەر ڕەشوەی قبوڵ کرد ئەوا دەیگەیەنێت بە کوفر.

مفسیر ئەم حەدیسەی رسول الله ﷺ هێناوەتەوە :

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : أن رسول الله ﷺ قال : إنّ مهر البغي، وثمن الكلب، السَّنور، وكسب الحجام من السحت .

رسول الله ﷺ فەرموویەتی : پارەی ئافرەتی زیناکار و پارەی سەگ و پشیلە [مەبەستی لە کڕین و فرۆشتنیەتی]، وە دەستخستنی پارەی ئەوانەی کەڵەشاخ دەکەن ئەوا لە ڕەشوەیە .

**٣٠ - مقاتل بن حيان** لەم ئایەتەدا : (وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٣] .

دەڵێت : لە تەوڕاتدا ڕەجمی ئافرەتی زیناکار و پیاوی زیناکاری تێدایە، وە ئیمان هێنان بە محمد ﷺ، وە بەڕاستخستنەوەی .

تەفسیری (ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٤]

٣١ - **الحسن** دەڵێت : ئەهلی پەرستشی الله ن، وە ئەهلی ئەوانەی تەقوای الله دەکەن .

٣٢ - **ابن عباس** وتی : ئەوانە ئیمانداراننن .

٣٣ - **مقاتل** لەم ئایەتەدا : (مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٤] .

دەڵێت : واتە : ڕەجم کردن و ئیمان هێنان بە محمد ﷺ .

---

: سەلەف یەک لەخاڵەکانی عەقیدە کە لەکتێبەکانیان باسیان کردووە ڕەجم کردن بووە وجەختیان زۆر لەسەر کردووتەوە وەک مخالفێک بۆ ئەوانەی دەڵێن لەقورئان باسی ڕەجم نەکراوە .

٣٤ - **الربيع بن أنس** لەم ئایەتەدا : (وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٤] .

دەڵێت : لەسەر فێرکردنی قورئان هیچ پارەیەک وەرمەگرە .

تەفسیری (وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٤٤] .

٣٥ - **ابن عباس** دەڵێت : هەرکەسێ ئینکاری حوکمێکی الله بکات کە دایبەزاندووە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێ دانی پێدابنێ بەڵام حوکمی پێنەکات ئەوە زاڵم و فاسقە .

دەڵێت : هەرکەسێ ئینکاری شتێکی سنووری الله بکات ئەوا کوفری کردووە .

٣٦ - **زيد بن أسلم** دەڵێت : هەرکەسێ حوکم بکات بەو کتابەی کە بە دەستی خۆی نوسیویەتیەوە وە وازبێنێت لە کتابی الله، وە پێی وابێت ئەو کتابەی کە بەدەستی خۆی نوسیویەتیەوە لەلایەن الله وەیە ئەوا کوفری کردووە .

٣٧ - **ابن طاوس** وتی : ئەوە وەک کوفرکردن بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و و نێردراوەکانی نییە .

٣٨ - وە لە **عطاء** ڕیوایەت کراوە کە وتویەتی : کفر دون کفر ە، [کوفرێکە لەدین دەرتناکات] .

(ٱلظَّٰلِمِينَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٥١] .

٣٩ - **محمد بن إسحاق** دەڵێت : واتە : دووڕووەکان ئەوانەی کە بە زمانیان گوێڕایەڵیان دەرخستووە، وە دڵیشیان پێداگرە لەسەر سەرپێچی کردنی الله تعالى .

٤٠ - **أبي العالية** دەڵێت : واتە : هەرکەسێ پشت لەوە بکات کە بڵێ: لا إله إلا الله .

٤١ - بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە **عكرمة** و **قتادة** و **الربيع بن أنس**.

(فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٥٤]

٤٢ - **ابن عباس** دەڵێت : ئەوە وەعدێکە لە الله وە، کە هەرکەسێ هەڵگەڕێتەوە [لە مسوڵمانەوە بۆ کافر] ئەوا الله ئەوان دەگۆڕێتەوە بە کۆمەڵانێک کە لەوان باشترن .

٤٣ - **الحسن** دەڵێت : ئەوە والله أبو بکر و هاوەڵەکانیەتی رضي الله عنهم.

(ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٥٥] .

٤٤ - **الزهري** وتی : کردنی هەر پێنج نوێژەکەیە لەکاتی خۆیدا .

(وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٥٨] .

٤٥ - **السدي** وتی : پیاوێک لە نەصارا لە مەدینە، کاتێ گوێی لە بانگدەرێک بوایە بانگی کردبا : أشهد أن محمداً رسول الله ﷺ، وتی : ئەو درۆزنە بسوتێنن .

شەوێ لە شەوەکان خزمەتکارەکەی چووە لای و چاودێری کرد کە ئەویش نوستبوو وە خێزان و مناڵەکانیشی نوسبتوون، پڕشنگە ئاگری خستە ناویان و ماڵەکەی ئاگر تێبەردا، ئەو و ماڵ و خێزانیشی ئاگر تێبەردا .

(يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٦٣]

**٤٦ - يحيى بن يعمر** وتی : علي بن أبي طالب رضي الله وتاریدا سوپاس و ستایشی الله تعالی کرد، پاشان وتی : ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بەهەلاکەت چوون بەهۆی ئەو تاوانانەی کە پێیدا تێپەڕیون و کەوتەنە ناوی، وە زانا و گەورەکانیان ڕێگریان لێنەکردوون، کاتێ کە سنووریان بەزاند لە تاوانکردن، وە زانا و گەورەکانیان ڕێگریان لێنەکردن، الله تعالی سزای پێدان، بۆیە فەرمان بکەن بە چاکە، وە نەهی بکەن لە خراپە پێش ئەوەی الله تعالی ئەوە دابەزێنێتە سەرتان کە دایبەزاندبوو بۆ سەر ئەوان، وە بزانن کەوا فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ڕزق نابڕێت، و ئەجەلیش نزیک ناکاتەوە .

(وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٦٤]

٤٧ - **ابن عباس** دەڵێت : ئەوان مەبەستیان ئەوە نییە کە دەستی الله بەستراوەتەوە، بەڵکو دەڵێن : ڕەزیلە، دەستی گرتووە بەوەی لای خۆیەتی، گەورەی و بەرزی بۆ الله لەوەی کە دەیڵێن گەورییەکی یەکجار گەورەیە .

(ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٦٤]

٤٨ - **إبراهيم التيمي** دەڵێت : موشتومڕی و مناقشەکردنە لە دین .

٤٩ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (وَعَمِلَ صَٰلِحًا) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٦٩] .

دەڵێت : کردەوەی چاک : الله أكبر، الحمد لله، سبحان الله، لا إله إلا الله یە [هێندە گران نیە وتنی، نە سەرکەوتن بەسەر شاخی دەوێت، نە هیچ شتێ، تەنیا زمانتە کە ڕابێنی لەسەری] .

٥٠ - **سعيد بن جبير** لەم ئایەتەدا : (فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ)، واتە : لە ئاخیرەتدا، (وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ)، واتە : بۆ مردن دڵتەنگ نابن .

(لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٧٨]

٥١ - **أبي مالك الغفاري** دەڵێت : لەعنەتیان لێكرا لەسەر زمانی داود علیه السلام بوون بە مەیمون، وە لەعنەتیان لێكرا لەسەر زمانی عیسى بن مریم علیهما السلام بوون بە بەراز .

٥٢ – بە هەمان شێوە لە **مجاهد** ڕیوایەت كراوە .

(ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٧٨]

٥٣ - **قتادة** دەڵێت : خۆتان دوورخەنەوە لە تاوان و دژایەتی كردن، چونكە بەمانە خەڵكانی پێش خۆتان لەناوچوون .

(وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ) [سُورَةُ المَائـِدَة :٨٢]

٥٤ - **السدي** دەڵێت : نەجاشی دوانزە كەسی ناردە لای رسول الله ﷺ :

كە حەوت دانەیان لە سەرانی نەصارا بوو [زانایەكی خواپەرستیشی پێدەوترێ]، وە

پێنج دانەشیان لە زاناکانیان بوو، سەیریان دەکرد و پرسیاریان لێدەکرد، کاتێ پێی گەیشتن، ئەوەی بۆیان خوێندنەوە کە دابەزیبووە سەری گریان و ئیمانیان هێنا، الله تعالى ئەوەی دەربارەی ئەوان دابەزاند: (وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ).

---

: ئەڤەری تر هەبوون دەربارەی بەڵام نزیک بوون لەیەکترەوە بۆیە دامانەنا تەنیا لەژمارەی پیاوەکان جیاوازی هەبوو .

(خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٨٥] .

٥٥ - **ابن عباس** دەڵێت: هەواڵیان پێ دەدات: کەوا پاداشتی هەتا هەتایی بۆ نیشتەجێبوانی [بەهەشت] هەیە، هیچ لێیان دانابڕێت ئەو پاداشتە .

تەفسیری: (لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٨٩] .

٥٦ - دایکمان **عائشة** رضي الله عنها دەفەرموێت : ئەوە قسەی کەسێکە کە بڵێت: نەخێر والله، بەڵێ والله .

٥٧ - **سعيد بن جبير** دەڵێت : ئەوە کەسێکە کە سوێند لەسەر تاوان دەخوات، واتە : [سوێندی دەخوات] کە نوێژ نەکات، یان کاری خێر نەکات .

٥٨ - **إبراهيم** دەڵێت : ئەوە کەسێکە کە سوێند لەسەر شتێ دەخوات، پاشان لەبیری دەکات .

٥٩ - **زيد بن أسلم** دەڵێت : ئەوە قسەی پیاوێکە کە دەڵێت : الله چاوم کوێر بکات گەر ئاوا و ئاوا نەکەم، الله لەماڵەکەم دەرمکات گەر بەیانی نەیەم بۆلات، ئەوە ئاوایە .

٦٠ - **ابن عباس** دەڵێت : (لغو اليمين) : ئەوشتە لە خۆت حەڕام بکەی کە الله حلاڵی کردووە بۆت، ئا لەوەدا هیچ کەفارەتێکت لەسەر نییە .

٦١ - **ابن عباس** لە ئەثەری تر دەڵێت : (لغو اليمين) : سوێند بخۆیت لە کاتێ کە توڕەیت .

(وَٱلْمَيْسِرُ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٩٠] .

٦٢ - **ابن عباس** دەڵێت : ئەوە قومارە، کە لە سەردەمی جاهیلی قوماریان دەکرد تاوەکو هاتنی ئیسلام، الله تعالی نەهی کرد لەو ڕەوشتە ناشرینە .

٦٣ - لە **مجاهد** ەوە و **عطاء** و **طاوس**، کە سفیان وتی : دووان لەوان وتیان : هەموو شتێک کە قوماری پێبکرێ ئەوا لە : گرەوکردنە، تەنانەت یاریکردنی مێرد منداڵ بە گوێز .

٦٤ - لە **راشد بن سعد** و **ضمرة بن حبيب** بە هەمان شێوە هاتووە .

٦٥ - عثمان باسی کرد لەلای **الحسن بن علي** رضي الله عنهما، وتی : ئەوە ئەمیری ئیمانداارانە علي رضي الله عنه ئێستاکە دێتە لاتان و لەو بپرسن، ئیمامی علي رضي الله عنه هات و پرسیاریان لێکرد، ئیمامی علي رضي الله عنه ئەو ئایەتەی سورەتی المائدة ی خوێندەوە : (لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ)، هەرکاتێ تێدەپەڕی بەسەر هەر حەرفێکی ئایەتەکە، دەیوت : عثمان رضي الله عنه یەکێکە لە بڕواداران، عثمان رضي الله عنه

یەکێکە لە تەقواداران، پاشا ئایەتەکەی خوێندەوە تاوەکو : (وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٩٣] .

(ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٩٧] .

٦٦ - **ابن عباس** دەڵێت : اللّٰه تعالى لەوحی محفوظی درووست کرد بە ئەندازەی هەزار ساڵ، پێش ئەوەی درووستکراوەکانی درووست بکات کە خۆی - اللّٰه تعالى - لەسەر عەرشە بە قەڵەمی فەرموو : بنووسە .

قەڵەمەکە وتی : چی بنووسم؟

فەرمووی : زانستم بە درووستکراوەکانم تاوەکو ڕۆژی قیامەت، قەڵەمیش بەهەموو ئەو شتانەی بە عیلمی اللّٰه تعالى ڕوودەدات تاوەکو ڕۆژی قیامەت نوسی، ئەوە ئەو فەرمایشتەیە کە بە رسول اللّٰه ﷺ فەرمووە : (أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ) .

٦٧ - **مطرف** ئەم ئایەتەی خوێندەوە : (شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ٩٨] .

وتی : ئەگەر خەڵکی قەدری گەورەیی سزای الله و توڕەبوونی الله و دابەزینی سزا بۆ سەریان بزانیایە، ئەوا فرمێسکیان دەڕشت و چاویان بۆ هیچ شتێ جێگیر نەدەبوو .

(قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠٠] .

٦٨ - **السدي** وتی : (ٱلْخَبِيثُ) : موشریکانن .

(ٱلطَّيِّبُ) : ئیماندارانن .

تەفسیری (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠١] .

٦٩ - ئیمامی **علي** رضي الله عنه دەفەرموێت : لەوکاتەی ئەو ئایەتە دابەزی : (فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ) [سُورَةُ آلِ عِمرَان : ٩٧] .

وتیان : ئەی رسول الله ﷺ حەجكردن لە هەموو ساڵێك؟

رسول الله ﷺ بێدەنگ بوو، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی : (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تَسْئَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) .

---

: هەرچەندە لە حاشیەكەی نوسراوە ئیسنادەكەی ضعیفە، بەڵام شواهدی تری هەیە وەک ئەوەی لە مسلم هاتووە :

لە أبي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ وتاری بۆ داین، فەرمووی : ئەی خەڵكینە حەجتان لەسەر فەرز كراوە حەج بكەن .

پیاوێ وتی : هەموو ساڵێك یا رسول الله ﷺ؟

ئیتر رسول الله ﷺ بێدەنگ بوو تا سێ جاری تر گوتیەوە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : ئەگەر وتبام : بەڵێ ئەوا واجب دەبوو لەسەرتان، وە نەشتاندەتوانی .

پاشان فەرمووی : واز لەوە بێنن كە بۆتان دانەنراوە [چونكە لەوانەیە نارەحەتی و مەشەقەتی تێدابێ بۆیان]، چونكە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زۆر پرسیاركردن و جیاوازیان لە پێغەمبەران لەناوچوون، ئەگەر فەرمانتان پێكرا بەشتێك ئەوا بۆی بچن و

جێبەجێی بکەن ئەوەندەی لەتواناتاندا بوو، وە کاتێ نەهیتان لێکرا لەشتێك ئەوا وازی لێبێنن .

**[صحيح مسلم : (١٣٣٧) - كتاب الحج، باب فرض الحج مرة في العمر ٩٧٥/٢]** .

**٧٠** - لە ابن أبي حُسَين، لە شهر بن حوشب، لە عبدالرحمن بن غنم، لە أبي مالك الأشعري، یان باوکی عامر، کە هەموویان ثقەن [متمانەپێکراون]، کاتێ لای رسول الله ﷺ بوون، ئەو ئایەتە دابەزی : (**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ**) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠١] .

رسول الله ﷺ باسی سیفەتی قەومێکی کرد کە نە پێغەمبەرن وە نە شەهیدن، پێغەمبەران و شەهیدەکان تەمەننای ئەوان دەکەن بەهۆی نزیکیان لە الله لەڕۆژی قیامەتدا، فەرمووی : ئەوانیش بێدەنگ بوون و لەهیچ شتێکیان نەپرسی .

**٧١** - **ابن عباس** دەڵێت : ئایە دەزانیت ئەو ئایەتە دەربارەی چی دابەزی : (**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ**)؟

وتی : کۆمەڵەیەک پرسیاریان لە رسول الله ﷺ دەکرد بەگاڵتەپێکردنەوە، دەیانوت : کێ باوکمە؟

وە پیاوێ کە حوشترەکەی ون ببا دەیوت : کوا حوشترەکەم؟

الله تعالی ئەو ئایەتەی دەربارەی ئەوان دابەزاند .

٧٢ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا دەڵێت : (لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠٥] .

دەڵێت : ئەگەر بەندە گوێڕایەڵیم بکات لەوەی کە فەرمانم پێ کردووە لە حەڵاڵ و حەڕام، ئەوا کەسی گومڕا ناتوانێ زیانی لێبدات ئەگەر کاری بەوە کرد کە فەرمانم پێ کردووە .

٧٣ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : (ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠٦]

دەڵێت : ئەگەر مرد و مسوڵمانانی لەلا بوو، ئەوا الله تعالی فەرمانی پێکردووە کەوا دوو کەسی دادپەروەر لە مسوڵمانان شایەت بن لەسەر ئەو وەسیەتەی کە دەیدات .

(أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠٦] .

٧٤ - **ابن عباس** دەڵێت : جگە لە مسوڵمانان لە ئەهلی کیتاب .

٧٥ - لە **عبيدة** و **شريح** و **سعيد بن مسيب** و **محمد بن سيرين** و **يحيى بن يعمر** و **عكرمة** و **مجاهد** و **سعيد بن جبير** و **الشعبي** و **إبراهيم النخعي** و **قتادة** و **أبي مجلز** و **السدي** و **مقاتل بن حيان** و **عبد الرحمن بن زيد بن أسلم**، بە هەمان شێوە ڕیوایەت کراوە .

٧٦ - **ابن شهاب** دەڵێت : ئەوانە لە ئەهلی میراتن .

٧٧ - **السدي** دەڵێت : ئەوە لەسەفەر دایە کاتێ پیاوێ مردن پێی دەگات لە سەفەردا، وە هیچ کام لەوانەی لەلای ئامادەن مسوڵمان نین، ئەوا داوا دەکرێ لە دوو پیاوی جولەکە یان گاور یان مەجوس، وەسیەتەکەی بۆ لای ئەوان دەبات، وە میراتەکەشی دەباتە لایان و ئەوانیش قبوڵی دەکەن، ئەگەر خاوەن مردووەکە ڕازی بوون بەو وەسیەتە، وە بە سەروەت و سامانی خاوەنەکەیان زانی ئەوا واز لەو دوو پیاوە دێنن، ئەگەر گومانیان لێ هەبوو

ئەوا باسەکە دەبەنەوە لای سلطان، ئەوەش ئەو فەرمایشتەیە : (تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٠٦] .

## عیسى بن مريم علیه السلام چی دەکرد گەر مردوویەکی زیندوو کردباوە؟

٧٨ - **أبي هذيل** وتی : عیسى بن مريم علیه السلام گەر ویستبای مردوویەك زیندوو بکاتەوە ئەوا دوو ڕکعات نوێژی دەکرد، لە ڕکعەتی یەکەم ئەمەی دەخوێند : (تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ)، [سُورَةُ المُلك : ١]، وە لەهی دووەمیش ئەمەی دەخوێند : (الٓمٓ (١) تَنزِيلُ) [سُورَةُ السَّجدَة : ١ - ٢] .

کە تەواو بوو لەکردنی ئەو نوێژە، مەدحی و ستایشی الله دەکرد، پاشان بە حەوت ناو داوای دەکرد لە الله تعالى : یا قديم، یا خفي [لە هەندێ نسخە نوسراوە : حي]، یا دائم، یا فرد، یا وتر، یا أحد، یا صمد،

وە گەر تووشی نارەحەتی ببوایە ئەوا داوای دەکرد بە حەوت ناوی دیکەی الله تعالى : یا حي، یا قيوم، یا الله، یا رحمن، یا ذا الجلال والإكرام، یا نور السموات والأرض وما بينهما ورب العرش العظيم، يارب .

(إِلَى ٱلْحَوَارِيِّنَ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ١١١] .

٧٩ - **ابن عباس** دەڵێت : ناویان لێنراوە (ٱلْحَوَارِيِّنَ) : ئەوانە ماسیگر بوون، بەهۆی سپی جلەکانیانەوە [ناویان لێنراوە الحواريون] .

**مسلم البطين** بە هەمان شێوە ڕیوایەتی کردووە .

(إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ١١٢] .

٨٠ - **عائشة** رضي الله عنها دەفەرموێت : ئەوان [حەوارییەکان] دەیانزانی کە الله تعالى دەتوانێت کاتی دەڵێن : ئایە پەروەردگارت دەتوانێت؟

بەڵکو ئەوان [مەبەستیان ئەوەبوو] کە : ئایە تۆ دەتوانیت داوا لە پەروەردگارت بکەیت؟

(أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ..) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٢] .

٨١ - **ابن عباس** باسی دەکرد : کە عیسی بن مریم بە بەنی ئیسرائیلی وت : ئەی بەنی ئیسرائیل ئایە سی ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن بۆ الله، پاشان داوای لێبکەن، ئەویش ئەوەتان پێدەبەخشێت کە داواتان کردووە، مەگەر کرێی کرێکار لەسەر ئەوکەسەیە کە کاری بۆ کردووە؟ [مەبەستی لەوە دێت کە ئێوە بۆ الله بەڕۆژوو بن پاداشتتان لەسەر ئەوە] .

پاشان وتیان : ئەی فێرکاری چاکە، بە ئێمەت وت : کە کرێی کرێکار لەسەر ئەوکەسەیە کە کاری بۆ کردووە، وە فەرمانت پێکردین سی ڕۆژ بەڕۆژوو ببین بۆ الله ئەوەشمان ئەنجامدا، کارمان بۆ هیچ کەسێک نەکردووە سی ڕۆژ ئیللا خواردنی پێداوین ئەو ڕۆژەی کە خواردنمان تەواو دەبوو، ئایە پەروەردگارت دەتوانێت خوانێکمان بۆ دابەزێنێت لە ئاسمانەوە، فەرمووی : (ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٢] .

﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا ..﴾ [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٣] .

٨٢ - **سلمان الخير** وتی : کاتێ حەوارییەکان داوای خوانێکیان لە عیسی بن مریم علیهما السلام کرد زۆر پێی تورە بوو، وە وتی : ڕازی بن بەو ڕزقەی الله پێتانی داوە لە زەویدا، داوای سفرە و خوان لە ئاسمان مەکەن، چونکە بەڕاستی ئەگەر بەسەرتاندا دابەزێت ئەوا نیشانەیەکە لە الله وە، وە ثمود لەناوچوون کاتێ داوای نیشانە و بەڵگەیان لە پێغەمبەرەکانیان کرد، بەوە تاقیکرانەوە تاوەکو خرانە نێو دۆزەخەو، پشتیان تێکرد ئیللا داوای بەڵگەو نیشانەیان دەکرد، هەربۆیە [حەوارییەکان] وتیان : ﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٣] .

٨٣ - **سليمان الخير** وتی : کاتێ عیسی بینی ئەوان تەنیا داوای ئەوەی لێدەکەن [واتە داوای دابەزینی خوانی لێدەکەن لە ئاسمانەوە]، هەڵسا و جلە صوفەکەی دانا، ئەو جلەی لەبەرکرد کە خوری بوو وە جوبەیەك کە ئەویش لە خوری بوو وە عەبایەك لە خوری، پاشان دەستنوێژی هەڵگرت و خۆی شوشت، وە چوو بۆ شوێنی نوێژ، ئەوەندە نوێژی کرد کە الله ویستی لێبوو، کاتێ لە نوێژەکەی تەواو بوو، هەڵسا لە بەرامبەر قیبلە وەستا،

قاچەکانی ڕیز کرد تا وەکو یەکی لێکردن، پێی بەپێیەکەی تری نوساندبوو، پەنجەکانی لەسەر پەنجەی تری دانابوو، دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا لەسەر سینگی، وە چاوەکانی داخستبوو، وە سەری نزم کردبویەوە لە ترسان [واتە لە حاڵەتی خشوع بووە جا سەری نزم کردووتەوە]، پاشان چاوی دەستی بەگریان کرد، بەردەوام فرمێسك بەسەر ڕوومەتیەوە دەهاتە خوارەوە، وە لەدەوروبەری ڕیشی تنۆکەی فرمێسکی لێ دەهاتە خوارەوە تاوەکو زەوییەکە و دەوربەری ڕووخساریشی بوو بە فرمێسك لەبەر خشوع و ترسانەکەی، کاتێ ئەوەی بینی داوای لە اللە کرد فەرمووی : (ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ١١٤] .

٨٤ - **سلمان** لەم ئایەتەدا : (أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ) [سُورَةُ المَائِـدَة : ١١٤] .

دەڵێت : اللە تعالی سفرەیەکی سووری بەسەریاندا دابەزاند کە لەنێوان دوو هەور بوون : هەورێك لەسەرەوەی بوو، وە هەورێکیش لەژێرەوەی بوو .

٨٥ - **ابن عباس** دەڵێت: بە عیسی بن مریم یان وت: داوا لە پەروەردگارت بکە سفرە خوانێکمان بۆ دابەزێنێت لە ئاسمانەوە، فریشتەکان دابەزین کە سفرە خوانێکیان هەڵگرتبوو، کە حەوت نەهەنگ و حەوت کولێرەی لەسەربوو، خەڵکانی تر لێیان خوارد هەروەکو ئەوانەی کە سەرەتا لێیان خوارد [واتە بەشی هەمووانی کرد، هەموویان وەکو یەك خواردیان].

٨٦ - **عمار بن ياسر** لەم ئایەتەدا: (إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ) [سُورَةُ المَائـِدَة: ١١٥].

دەڵێت: پێمان دەڵێت [ئەم ئایەتە] کە: ئەوان دەگۆڕێن بۆ بەراز.

وتی: **الحسن** دەڵێت: کاتێ پێیان وترا: (فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا).

وتیان: ئێمە پێویستمان بەمە نییە، بۆچی دابەزیوە.

٨٧ - لە **عمر بن أبي العاص**، کە رسول الله ﷺ ئەو وتەی عیسی علیه السلام دەخوێندەوە: (إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ) [سُورَةُ المَائـِدَة: ١١٨].

دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی : ئەی پەروەردگار ئومەتم ئومەتم، وە گریا، الله تعالی فەرمووی : ئەی جبریل برۆ لای محمد، پەروەردکاری زاناترە، پرسیاری لێبکە بۆچی دەگریەت؟

جبریل علیه السلام هاتە لای پرسیاری لێکرد، هەواڵی پێدا بەوەی رسول الله ﷺ فەرمووی، ئەگەرچی الله خۆی دەیزانی .

الله تعالی فەرمووی : ئەی جبریل برۆ لای محمد پێی بڵێ : من لە ئومەتەکەت ڕازی دەبم دڵتەنگ مەبە .

٨٨ - **السدي** لەم ئایەتەدا : (وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ)

وتی : دەردەهێنرێن لە گاورێتی [نەصرانیەت]، وە هیدایەت دەدرێن بۆ ئیسلام، (فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٨] .

ئەمە قەولی عیسى علیه السلام ە لە دونیادا .

(لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١١٩] .

٨٩ - **عبدالله** وتی : ڕووبارەکانی بەهەشت لە چیای میسکەوە دێنە خوارەوە .

٩٠ - **أبي مالك** وتی : (تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ)، واتە : دانیشتوانانی بەهەشت ڕووبارەکارن لەژێریانەوە تێدەپەڕێت .

٩١ - **محمد بن إسحاق** لەم ئایەتەدا : (وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌۢ) [سُورَةُ المَائـِدَة : ١٢٠] .

وتی : واتە : الله تعالی هەرچی بوێت لە بەندەکانی هەم لە سزا هەم لە لێخۆشبوون توانای هەیە .

الحمد لله، بەفەزڵی الله پوختەی سورەتی المائدة تەواو بوو، بەتەفسیری إبن أبي حاتم رحمه الله .

الله لێمانی قبوڵ بکات و ببێتە مایەی سوودی نەبڕاوە بۆ هەموو لایەك .

والحمد لله ربِّ العالمين

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين وسَلَّمَ تسليمًا

https://t.me/Alaikumbisuuna

